77



# میری شاد





نووسینی: ئۆسکار وایەڵد
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: سەباحی مەلا






# میری شاد

نووسینی: ئۆسکار وایەڵد

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: سەباحی مەلا

وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتی زنجیرە کتێبی منداڵان




خاوەنی ئیمتیاز: وەزیری رۆشنبیری
سەرنووسەر: نیان ئەحمەد

# میری شاد

زنجیرەی کتێب : ( ٧٧ )
ناوی کتێب : میری شاد
نووسینی: ئۆسکار وایەڵد
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: سەباحی مەلا
دیزاین : حەمە هاشم
هەڵەچن و پێداچوونەوەی : هێمن جاسم
تایپ : مستەفا مەولود
سەرپەرشتیاری چاپ : عەبدولقادر عەلی مەردان
ژمارەی سپاردن ( ٢٥٤٠ )
٢٠٠٩
تیراژ : ( ١٠٠٠ ) دانە
نرخی : ( ١٠٠٠ ) دینار

زنجیرە کتێبی منداڵان لەسەر ئەم سایتە بخوێنەوە:
www.kurdchap.com



هەبوو نەبوو میرێک هەبوو, ئەو میرە لە کۆشکێک دەژیا پێیان دەگوت (کۆشکی شادی), تا بڵێی بە خۆشی و شادی دەژیا, هەر لەبەر ئەمە دەست و پێوەندەکانی ناو کۆشک ناویان نابوو میری شاد.

ساڵ هات و ساڵ چوو میری شاد چووە ناو ساڵەوەو پیر بوو,





ڕۆژێکیان میری بە ساڵاچوو کۆچی دوایی کرد، دەست و پێوەندەکانیشی هەڵسان پەیکەرێکیان بەبەردا کرد و لە ناوەڕاستی گۆڕەپانێکی گەورەی ناو شاردا ، لە شوێنێکی بەرز دایاننا.





پەیکەرەکەیان بە زێڕ
ڕووکەش کرد و لە جیاتی
چاو ، دوو پیرۆزەی
گرانبەهای شینیان بۆ
دانا و یاقووتێکی سووری
بە نرخیشیان بە دەسکی
شمشێرەکەیەوە خست.



شەوێک لە شەوانی کۆتایی وەرزی هاوین، پەڕەسێلکەیەکی بچکۆلانە بە تەنیا بە ئاسمانی شارەکەدا دەفڕی، لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا پەڕەسێلکەکان هەموو بەرەو وڵاتی ( میسر ) کۆچیان کردبوو.





هەروەک دەبینی لە وەرزی زستان و ساردیدا، پەڕەسێلکە بەرەو گەرمیان دەچن، بەڵام پەڕەسێلکە تەنیاکە گوتی: دەبێ بۆ نووستن شوێنێک بۆ خۆم بدۆزمەوە.







دوای چەند ساتێک گەڕان و سوڕان، لەناکاو چاوی بە پەیکەری ( میری شاد ) کەوت هەستی بە خۆشییەکی بێ پایان کرد و گوتی: بە خوا شتی چاکە! ئەمشەو لێرانە دەنووم.

لە ژێر پێیەکانی پەیکەری میری شاد نیشتەوە.





پەرەسێلکە بچکۆلانەکە زۆر شەکەت و ماندو
بوو. سەری خستە ژێر باڵییەوەو ویستی بنوێ،
بەڵام دڵۆپە ئاوێکی گەورە تەپ بەسەریدا
کەوت، گوتی: بەخوا سەیرە! ئاسمان پەڵە
هەورێکی پێوە نییە کەچی باران دەبارێ.



دڵۆپێکی دیکە بەسەریدا باری. گوتی: چیتر ناتوانم
لێرە بمێنمەوە، پێویستە شوێنێکی دیکە بۆخۆم
بدۆزمەوە بۆ ئەوەی لێی بحەوێمەوە
کاتێ دڵۆپی سێیەمی بەرکەوت سەری بەرزکردەوە،
باوەڕناکەم بزانی پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە چی بینی!



چاوەکانی (میری شاد) پڕبوون لە فرمێسك, دڵۆپی
فرمێسك بە چاوانیدا ئەهاتە خوارێ, تا بڵێی جوان و خەمبار
بوو, تەنانەت پەڕەسێلکە بچکۆلانەکەش خەم دایگرت.





پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە پرسی: تۆ کێیت.
پەیکەرەکە وەڵامی دایەوە: من میری شادم.
پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە گوتی: بەڵام تۆ شاد
نیت، تۆ دەگری؟؟





پەیکەرەکە گوتی: لێرە لەم بەرزاییەوە هەموو ئەو
شتە غەمبار و ناشرینانەی ناو شار دەبینم, دڵم لە
مس دروست کراوە, بەڵام ئەو شتانەی ڕۆژانە من
دەیبینم وام لێ دەکەن کە بگریم.



پەیکەر گوتی: کاتێ منداڵ بووم هەرگیز نەدەگریام، من لە
کۆشکی شادی دا دەژیام، هەموو ڕۆژێ لەگەڵ برادەرەکانم
لەناو باخچەی کۆشک یاریم دەکرد و هەرگیز کۆشکم جێ
نەدەهێشت، تەنانەت ڕۆژێکیش بۆ ناو شار
دانەبەزیبووم، هەردەم شاد و دڵخۆش بووم، هەربۆیە
برادەرەکانم بە ( میری شاد) بانگیان دەکردم.
دوای مردنم پەیکەرێکیان بەبەردا کردم و منیان لەم
بەرزاییە دانا بۆ ئەوەی شار ببینم. دەبینی وا ئێستاش
شاد نیم و تا بڵێی غەمبارم.



پەرەسێلکە بچکۆلانەکە
گوتی: بەڵام باشە تۆ چی دەبینی؟



میر گوتی: زۆر لە دوور لە باریکە شەقامێکدا خانوویەک دەبینم، پەنجەرەکەی کراوەتەوەو ژنێکم لێوە دیارە لەسەر تەختەیەک دانیشتووە، دەم و چاوی باریک، دەستەکانی سوور هەڵگەراون، زۆر هەژارە و خەریکی جل دوورینە، کورەکەی لە ناوجێدا کەوتووەو زۆر نەخۆشە، تایەکی گەرمی لێیە ، خەوی لێناکەوێ، زۆری تینووە، حەزی لە برێک شەربەتی پرتەقاڵە. بەڵام لەبەر بێ پارەیی، دایکی ناتوانێ بۆی بکرێ، پەرەسێلکە بچکۆلانەکە، من ناتوانم یارمەتییان بدەم چونکە توانای جوڵەم نییە، دەتوانی ئەم یاقوتەسورەی سەر شمشێرەکەمیان بۆ ببەی؟



پەرەسێلکە بچکۆلانەکە گوتی:
بەڵام من پێویستە ئێرە جێ
بهێڵم و کۆچ بکەم، هاورێکانم لە
وڵاتی (میسر) چاوەڕێم دەکەن.
میر گوتی: تکات لێ دەکەم
ئەمشەو لام بمێنەوە و یارمەتیم
بدە، ئەو کورە زۆر نەخۆشە
و دایکیشی زۆر غەمبارە.
پەرەسێلکە بچکۆلانەکە
نەیدەویست لەوێ بمێنێتەوە،
بەڵام بینی میر زۆر غەمبارە،
بۆیە گوتی: باشە ئەمشەویش
یارمەتیت دەدەم، بەڵام دەبێ
سبەی هەر بڕۆم.



پەرەسێلکە بچکۆلانەکە یاقوتە سورەکەی دەسکی شمشێرەکەی میری هەڵگرت و بەرەو لای ژنە هەژارەکە لە شەقەی باڵیدا و فری, ژنە لە ژوورەوە لەسەر کورسییەك خەوی لێ کەوتبوو, کراسێکی زۆر جوانیش لەسەر مێزەکە دانرابوو, کورەکەی لە جێدا کەوتبوو, بەڵام خەوی لێ نەکەوتبوو, پەرەسێلکە بچکۆلانەکە بینی ئەو کورە زۆر نەخۆشە, یاقوتە سوورەکەی لە تەنیشت کراسە جوانەکەی سەر مێزەکە دانا, بە دەوراندەوری جێگای منداڵەکە فری . منداڵەکە گوتی: ئێستا هەست بە ئارامی دەکەم چونکە بەرەو چاکبوونەوە دەچم, ئەمەی گوت و خەوی لێکەوت.



پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە لە شەقەقەی باڵیدا و
بەرەو لای پەیکەری میری شاد گەڕایەوە.

سەربردەی ژنە هەژار و کوڕەکەی بۆ گێڕایەوە.
میری شاد گوتی: دەست خۆش سوپاست دەکەم.
پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە گوتی: میری شاد من دەزانم هەواکەی ساردە, بەڵام ئێستا هەست بە گەرمی دەکەم.
میری شاد وەڵامی دایەوە: دەزانی بۆ وا هەست دەکەی؟
چونکە یارمەتی دوو کەست داوە.
پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە هەتا نوست بیری لە یارمەتیدانی خەڵکی دەکردەوە.



ڕۆژی پاشتر پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە زۆر دڵی خۆشبوو گوتی: نیازم وایە ئەمشەو بەرەو وڵاتی ( میسر ) کۆچ بکەم. بە ئاسمانی شارەکەدا فڕی و زۆر شتی بینی، دەوروبەری ئێوارە بەرەو گۆڕپانەکە گەڕایەوە و دەیویست خواحافیزی لە میری شاد بکات، بەڵام (میر) نەیدەویست پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە جێی بهێڵێ.



میری شاد گوتی: تکات لێ دەکەم ئەمشەو لام بمێنەوە.

پەرەسێلکە بچکۆلانەکە گوتی: بەڵام پێویستە ئەمشەو ئێرە جێبهێڵم، هاورێکانم لە وڵاتی ( میسر ) چاوەرێم دەکەن.

میر گوتی: لێرەوە ژورێکی دارزاوی یەکێ لە سەربانە دورەکان دەبینم کە کورێکی گەنجی تیا دەژی، لەبەردەم مێزێک دانیشتووە کە بە پەرە کاغەزی نووسراو داپۆشۆراوە، لەتەنیشت ئەمانیشەوە شوشەیەک دانراوە چەند گوڵێکی سیسی تیایە، دەیەوێ کتێبێک بنووسێ، بەڵام لەبەر ئەوەی ژوورەکەی ئاگری تیا نەکراوەتەوە، ئەمیش زۆری سەرمایە و برسیەتی، بۆیە تواناى نووسینی نەماوە، پەرەسێلکە بچکۆلانەکە من لەبەر ئەوەی ناتوانم بجوڵێم بۆیە ناتوانم یارمەتی بدەم، ئایا دەتوانی لە جیاتی من یارمەتی بدەی؟



پەرەسێلکە بچکۆلانەکە گوتی: زۆر باشە ئەمشەو لات دەمێنمەوە و یارمەتیت دەدەم, بەڵام سبەی دەڕۆم, بێنە یاقوتێکی دیکەم بدەرێ.

میر گوتی: یاقوتی سوورم نییە, بەڵام دەتوانی یەکێ لە چاوەکانم ببەی کە پیرۆزەی شینی گرانبەهان و لە وڵاتی هیندستانەوە هاتوون, هی هەزار ساڵ لەمەوبەرن, نووسەرەکە دەتوانێ ئەو پیرۆزەیە بفرۆشێ و بە پارەکەی خواردن و داریش بۆ ئاگردانەکەی بکڕێ و بەو شێوەیە دەتوانێ کتێبەکەی تەواو بکات.

پەرەسێلکە بچکۆلانەکە نەیدەویست چاوی میری شاد ببات, بەڵام میر دووبارە داوای لێکردەوە کەئەم کارە بکات و

گوتی: تکات لێ دەکەم یارمەتی ئەو نووسەرە بدە, چونکە ئەو پێویستی بەو پیرۆزەیە هەیە.

پەرەسێلکە بچکۆلانەکە پیرۆزەکەی هەڵگرت و بەرەو ژووری نووسەرە لاوەکە فڕی، نووسەرەکە زۆر غەمبار بوو، سەری خستبووە نێو دەستانی، نە پەرەسێلکە بچکۆلانەکەی بینی و نەگوێی لە شەقەی باڵەکانی بوو، کاتێ لە گریان وەستا و سەری بەرز کردەوە چاوی بە پیرۆزە شینەکە کەوت کە لەسەر مێزەکە لە تەنیش گوڵە سیسەکان دانرابوو، زۆر دڵخۆش بوو.



بۆ ڕۆژی دوایی پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە بەرەو بەندەری دەریا فڕی، چاوی بە دەریاوانەکان کەوت سەرقاڵی کاربوون، تا درەنگانێک لەوێ مایەوە تا کاتی ئەوەهات بگەڕێتەوەو خواحافیزی لە میری شاد بکات.

میری شاد گوتی: تکات لێدەکەم ئەمشەویش لام بمێنەوە.



پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە وەڵامی دایەوە: وا وەرزی زستان
هات و بەفر دەبارێ، ئێستا کەش و هەوا لە وڵاتی
( میسر)گەرمە. میرم بەهەر شێوەیەک بێ دەبێ بڕۆم، بەڵام
ساڵی داهاتوو کە گەڕامەوە یاقوتێکی سوور و پیرۆزەیەکی
شینت بە دیاری بۆ دێنم.



میری شاد گوتی: لە گۆڕپانەکە کچە شقارتە فرۆشێك هەیە هەموو شقارتەکانی لێ ڕژاونەتە سەر شەقامەکە و تەڕبوونە، خۆی دەزانێ کاتێ گەڕایەوە ماڵ باوکی زۆر لێ توڕە دەبێ و ئەویش دەگریی، بۆیە داوات لێ دەکەم پیرۆزە شینەکەی دیکەمی بۆ ببەی بۆ ئەوەی باوکی لێی توڕە نەبێ.





پەرەسێلکە بچکۆلانەکە نەیدەویست پیرۆزە شینەکەی دیکەی میری شاد لێ بکاتەوەو بۆ کچەکەی ببات, بۆیە هاواری کرد و گوتی: نەخێر دوایی کوێر دەبی.

میری شاد گوتی: تکات لێ دەکەم یارمەتی کچە شقارتە فرۆشەکە بدە و ئەو پیرۆزەیەی بۆ ببە, چونکە پێویستی پێیەتی.

پەرەسێلکە بچکۆلانەکە پیرۆزە شینەکەی ( میری شاد ) ی لێ کردەوەو بەرەو گۆرەپانەکە فری و کچەکەی لەسەر شەقامەکە دۆزییەوە, کچەکە زۆر خەمبار بوو, چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک, کاتێ پەرەسێلکە بچکۆلانەکە هات ئەم نەیبینی, پەرەسێلکە بچکۆلانەکە پیرۆزە شینەکەی خستە ناو دەستی کچەکەوە.

کچەکە گوتی: ئەوە چییە؟ ئەوە بەدێزی زۆر جوانە! ئیتر چیدی باوکم لێم تورە نابێ.

بەدەمی پێکەنینەوە بەرەو ماڵ بۆ لای باوکی ڕایکرد.



پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە فڕی و گەڕایەوە لای پەیکەری میری شاد, سەربردەی کچە شقارتە فرۆشەکەی بۆ گێڕایەوە. بە میری شاد ی گوت: ئیدی بە هیچ شێوەیەک بە جێت ناهێڵم ئێستا تۆ کوێر بووی, بۆ هەتایە لات دەمێنمەوە.



میر گوتی: نەخێر پێویستە هەر ئێستا بڕۆی, کەش و هەوا زۆر سارد بووە, بەڵام پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە چیتر گوێی لە میری شاد نەگرت, لە ژێر پێیەکانی لێی نووست.





شەو داهات و پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە گەڕایەوە لای میری شاد، ئەو شتانەی بینیبووی لە هەژارانی بێ دەرەتان و مندالآنی برسی و ڕووت و قووت و سەرما بردووی ناو شار هەر هەمووی بۆ گێڕایەوە.
میر گوتی: دەتوانین یارمەتیان بدەین، پەیکەرەکەی من بە توێژاڵێک زێر داپۆشراوە، پێویستە پارچە پارچە لێیان بکەیتەوەو بیدەی بە خەڵکانی هەژار و ڕووت و ڕەجاڵەکانی ناو شار.



بۆ بەیانی پەرەسێلکە بچکۆلانەکە پارچەیەک لە زێڕی پەیکەری ( میری شاد ) ی لێکردەوەو بۆ ئافرەتێکی هەژاری برد, ئیدی هەموو ڕۆژێ پارچەکەیەک زێڕی لێدەکردەوە و دەیبرد بۆ یەکێ لە هەژارانی شارەکە, ڕۆژ هات و ڕۆژ چوو تا وایلێهات پەیکەرەکە هیچ زێڕی پێوە نەما و بووە پەیکەرێکی کوێری ڕەنگ خۆڵەمێشی,

بەڵام لە هەمانکاتدا
سەرجەم هەژارانی شار
شاد و دڵخۆش بوون,
منداڵانی برسی تێر بوون و
جێگای حەوانەوەیان
بۆ ڕەخسا.



بەفر دایکرد و بەبێ پسانەوە بۆ ماوەی یەک هەفتە باری هەوا ساردی کرد, پەرەسێلکە بچکۆلانەکە لە سەرما قەسری بوو, بەڵام هەرگیز میری جێنەدەهێشت, پاشان بیری کردەوە, بێگومان من دەمرم, پێویستە خواحافیزی لە (میری شاد)بکەم.

گوتی: خواحافیز ئەی میر.

میر گوتی: ئۆو! دیارە بۆ وڵاتی میسر دەچی؟ بڕیارێکی زۆر باشە, ئەمڕۆ بەڕاستی ساردە.

پەرەسێلکە بچکۆلانەکە وەڵامی دایەوە: من بۆ وڵاتی میسر ناچم, من دەمرم, هەڵسا ماچێکی میری کرد و لە ژێر پێیەکانی نیشتەوە و مرد, لە ناکاو دەنگێکی گەورەی نا ئاسایی بەرز بۆوە, شریق ق ق! دڵی میری شاد بووە دوو لەتەوە!







بۆ بەیانی سەرۆکی شارەوانی و
پاوەرەکانی بە گۆڕەپانی شاردا
پیاسەیان دەکرد, سەری بەزر
کردەوە و پەیکەری
(میری شاد) ی بەرچاو کەوت و
گوتی: ئۆھ, بەداخەوە ! پەیکەری
(میری شاد) زۆر ناشرین بووە,
دەسکی شمشێرەکەی یاقوتی
سووری پێوەنەماوە و نە
چاوەکانی ماوە و نە رووپۆشی
زێڕینی پێوەماوە, باشە زێڕەکەی
چی لێهات؟ پەیکەرەکە رەنگی
خۆڵەمێشی هەڵگەڕاوە!
یاوەرەکانیشی لە هەمانکاتدا
سەیریان دەکرد, یەکێ لە
یاوەرەکانی (سەرۆکی شارەوانی)
گوتی: ئێمە ڕازی نابین پەیکەری
ناشرین لە شارەکەمان هەبێ,
هەر ئێستا دایگرنە خوارەوە! ئەو
تەیرە مردووەی ژێر
پەیکەرەکەش فرێدەن!

هەمان ڕۆژ پەیکەری ( میری شاد ) یان هێنایە خوارەوە و
ویستیان بیتوێننەوەو پەیکەرێکی نوێی لێ دروست بکەن
لەسەر شێوەی سەرۆکی شارەوانی, بەڵام چەندیان کرد
و کۆشان دڵە شکاوەکەی نەتوایەوە, ئەوانیش توڕیان
هەڵدایە ناو ئەو تەنەکە خۆڵەی پەرەسێلکە
بچکۆلانەکەیان تێ فڕێدابوو.





ڕۆژێکیان پەرییەک بە فڕین دابەزیە ناوشار
پرسیاری بەنرخترین دووشتی ناو شاری لە خەڵک
کرد, هەموو دانیشتووانی شار یەک وەڵامیان
هەبوو ئەویش "بەبەهاترین دوو شتی ناو شار
میری شاد و پەڕەسێلکە بچکۆلانەکەن".



پەرییەکە گوتی: بەڵام ناتوانم نە (میری شاد) و نە پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە بدۆزمەوە. لە گۆڕپانەکە پەیکەری نوێی لێیە پەیکەری ( میری شاد ) نییە و ئێستاش وا زستانە. لەم وەرزەیا کوا پەڕەسێلکە بچکۆلانەکە لە کوێ بدۆزمەوە؟

یەکێک لە پیاوانی سەرۆکی شاروانی گوتی پەیکەری (میری شاد) مان تواندەوە، بەڵام دڵەکەی نەتوایەوە، بۆیە فڕێماندایە ناو تەنەکەی خۆڵەکە.



پەرییەکە چوو دڵەکەی (میری شاد) ی لە ناو تەنەکەی خۆڵەکە دۆزییەوە, بینی پەرەسێلکە بچکۆلانە مردووکەشی لە تەنیشتی فرێدراوە, بۆیە هەردوکیانی هەڵگرت و بردنی بۆ یەزدان.
ئێستا (میری شاد) وا لە ناو باغ و باغاتی بەهەشت یاری دەکا و پەرەسێلکە بچکۆلانەکەش بە تەکیەوە گۆرانی دەچڕێ,
دووبارە میر و پەرەسێلکە بچکۆلانەکە شاد دەبنەوە...





